# کۆمەڵکوژییەکەی دەرسیم

ژنێک باسی کۆمەڵکوژییەکەی ساڵی (١٩٣٧-١٩٣٨)ی ناوچەی دەرسیم دەگێڕێتەوە

حوسێن یڵدرم

وەرگێڕانی لە سویدییەوە

کاوە ئەمین

# کۆمەڵکوژییەکەی دەرسیم

ژنێک باسی کۆمەڵکوژییەکەی ساڵی (١٩٣٧-١٩٣٨) ی ناوچەی دەرسیم دەگێڕێتەوە

نووسینی: حوسێن یڵدرم

وەرگێرانی لە سوێدییەوە: کاوە ئەمین

سلیمانی- ٢٠٠٧

مەڵبەندی کوردۆلۆجی

**ناوی کتێب:** کۆمەڵکوژییەکەی دەرسیم، ژنێک باسی کۆمەڵکوژییەکەی ساڵی ( ۱۹۳۷ –۱۹۳۸)ی ناوچەی دەرسیم دەگێڕێتەوە

**نووسینی:** حوسێن یڵدرم

**وەرگێڕانی لە سوێدییەوە:** کاوە ئەمین

**نووسینەوە:** وەرگێڕ

**دیزاین:** قادر میرخان

**بەرگ:** سۆران عەلی ئەمین

**چاپ:** یەکەم

**ژمارەی سپاردن:** ۳۲۷

**لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی (۳)**

# چەند پەیڤێک

جینۆساید و پاکتاوکردنی رەگەزی بە درێژایی سەدەی رابردوو لە ئاستی جۆراو جۆردا رووبەڕووی نەتەوەی کورد لە کوردستانی گەورە کراوەتەوە. دیارە لە سەردەمی عوسمانی و سەلجوقی و قاجارەکاندا دەیان هۆز و خێڵی کورد کە زوڵمی ئەو دەستەڵاتە بێگانانەیان قبوڵ نەکردووە، رووبەڕووی کۆچی بە کۆمەڵ بوونەتەوە و بەزۆر لە کوردستان وەدەر نراون. پاشان لە لایەن دەستەڵاتدارنی وڵاتانی نوێی وەکو تورکیا، سوریا، عێراق و ئێران بە تایبەتی لە دوای ساڵی ١٩٢٠ بە شێوەیەکی سیستەماتیک و بەکارهێنانی میتۆدی جۆراوجۆر درێژەیان بە توانەوەی کورد وەکو نەتەوەیەک دا، لە قەدەغەکردنی زمان و کولتوورەوە بگرە تا راگوێزانی بەکۆمەڵ و کوشتنی بە کۆمەڵ، ئەمەش بەتایبەتی لە ناوچەکانی باکووری کوردستان، دەرسیم لە ساڵی ١٩٣٦ تا ١٩٣٨ درێژەی کێشا، بە سەدان و هەزاران کوردی دەرسیمی لە نێو ئەشکەوتەکاندا بە زیندویی سوتێنران و سەرکردەکانیان لە سێدارەدران.

بۆ زانیاری خوێنەران دەبێت لە سەرەتاوە ئەوە روون بکەمەوە کە ناوچەی دەرسیم یەکێکە لە جوانترین ناوچەکانی کوردستان کە بە شاخی بەرز و کانیاو و رووبارەکانی بەناوبانگە. دانیشتوانی دەرسیم زۆربەیان بە زاراوەی زازاکی دەپەیڤن و خەڵکەکەشی بە بیروباوەڕی ئاینیان (عەلەوین) کە نزیکایەتی لەگەڵ مەزهەبی شیعەدا هەیە، هەربۆیە ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان و کوڕانی ناوچەی دەرسیم ناویان (عەلی، حوسێن و حەسەن)ە، هەروەک لەم کتێبەشدا دەبینین دەیان جار گوێبیستی ئەم ناوانە دەبین.

بەداخەوە کورد وەکو نەتەوە زۆر گرنگی بە کۆکردنەوەی دۆکیومێنت و بەڵگە نەداوە، نەک هەر ئەوە بەڵکو سەدان داپیرە و باپیرەی ئێمە ئەو تاوانانەی کە بەدژی گەلەکەمان کراون و ئەوان شایەتی بوون یانیش بۆ خۆیان بوونەتە بەشێک لەو

قوربانیانە، هەموو ئەو بەڵگە زارەکیانەیان لەگەڵ خۆیان بردۆتە ژێر گڵەوە و کەسێک نەهاتووە بیان نووسێتەوە. ئەم کتێبەی کە ئێستا لەبەر دەستدایە، گەواهی ئەوەمان بۆ دەدات کە ئەگەر دەیان ژن و پیاوی بەتەمەنی کورد بەسەرهاتەکانیان بگێڕایەتەوە و تۆمار بکرانایە، ئەوا ئێستا بەشێک لە مێژووی ونی کورد دەپارێزرا.

کام کورد هەیە کاتێک ژنێکی ئەنفال کراو بەسەرهاتی خۆی، منداڵ و کوڕ و کچەزا و بووک و خوشک و دایکیمان بۆ دەگێڕێتەوە کسپە لەجەرگی هەڵنەستێ، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین کە هەموو گوند و شارێکی ئەو کوردستانەی ئێمە تژییە لە بەسەرهاتی وا، پڕە لە کارەسات و تەجاوەزکردن بە کەرامەتی نەتەوەییمان، سەددام و بەعس ویستیان بە هێرشەکانی ئەنفال دوا بزمار لە تابوتی توانەوەی کورد بدەن لە باشووری کوردستان، ئەمە لە کاتێکدا کە ئێمە وەکو میللەتێک ئاگامان لەو هەموو ئەنفالە نییە کە سەدان ساڵە لە ژێر ناوی جۆراو جۆردا لێمان دەکەن!

لە زەمانی شێخ مەحمود، شێخ سەعید و سەید رەزاوە و بگرە پێشتریشەوە کورد تکاو رجا لە یەکیەتیی نەتەوەکانی ئەوسا و نەتەوە یەکگرتووەکانی ئێستا و دنیای مرۆڤایەتی دەکات کە سنوورێک بۆ جینۆسایدی کورد لە لایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە دابنێن، بەڵام مخابن ئەوان گوێی خۆیان ئاخنیوە و نابیستن.

پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت کەچەڵ ئەگەر خۆی دەرمانی سەری خۆی نەکات کەس بۆی ناکات، کوردیش ئەگەر خۆی لە ئەنفال نەگات و مێژووی خۆی بەدەستی خۆی نەنووسێتەوە، کەس بەفریای ناگات. بەو هیوایەی کە بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ سەر زمانی کوردی، توانیبێتم خزمەتێکی بچووک بە دۆزی نەتەوەکەم بکەم، خوێنەرانی ئەم زاراوەیە زیاتر بە تاوانەکانی تورک بەرانبەر بە نەتەوەی کورد ئاشنا بکەم.

**کاوە ئەمین**

**دیسێمبەری ٢٠٠٦**

## دەستپێک

ئەم کتێبە سەرەڕای ئەو فۆرمەی وەریگرتووە، داستانێکی خەیاڵی نییە. نووسەر هێندە بە دیقەتە، تەنانەت ناوو پاشناوی کەسەکانیشی نووسیوە. ئێما (ئەو ژنەی کە بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە .وەرگێڕ) تەنها منداڵێکە کە لە یەکێک لەو کۆمەڵکوژیانەی کە سوپای تورکیا لە باکووری کوردستاندا، ئەنجامی داوە، رزگاریی بووە. ئەم درامایە، بۆ هەتا هەتایە کاریگەری لەسەر ئێما بەجێهێشتووە.

تا ماوەیەکی دوورودرێژیش، هەوڵی داوە کە بتوانێت لەو مێژووە بگات، کە وای کردووە کارەساتێکی وا رووبدات. بە گەورەییش هەست بەو دابوونەریتە دەکات کە بووەتە قورسایەک وەکو چۆن کراسێکیان بەزۆر لەبەر کردبێت. بە پێچەوانەی هەموو دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان، ئەو حەیای ئەوەی هەیە کە خۆشەویستی بکات و پاشان منداڵێک بە دنیا بهێنێت.

حوسێن یڵدرم ماوەی سیانزدە ساڵ وەکو پارێزەر کاریکردووە، هەتا لە ساڵی ١٩٨١ دا، دەگیرێت، دوای ئەوەی کە بوێرانە لە دادگای شەڕدا، داکۆکی لە زیندانییەکان دەکات. هەمانکات بە زیندانەکانی رێژیمی ئانکارا، ئاشنا دەبێت. بە هۆی فشاری رێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی و کۆمیسیۆنی پارێزەرانی نێودەوڵەتی بۆ سەر تورکیا، پاش یانزدە مانگ ئازاد دەکرێت. پێش ئەوەی وڵات بەجێ بهێڵێ، داوا لە ئێما دەکات کە ئەو گێرانەوانەی کە راستەوخۆ لە بەساڵاچووەکانییەوە بیستووە بۆ بگێڕێتەوە. ئەو هیچ کاتێک بڕاوی بەکەس نەکردووە. ئەوەی لەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە، ئەو مێژووەیە. حوسێن یڵدرم، لە ساڵی ١٩٨١ بەدواوە وەکو پەنابەرێکی سیاسی لە وڵاتی سوێد دەژی.

گێراد چاوپیب (کە لەگەڵ مەتین ئاچار دا ئەم کتێبەی لە تورکییەوە کردۆتە فەرەنسی

## پێشەکی

ئێما لێنگە (شەل) ، بەسەرهاتێکە لەسەر بنەمای گێڕانەوەی شایەت حاڵێک کە باسی سەردەمێکی تراژیدیی پارێزگای دەرسیم دەکات.

دەرسیم "دەرگای زیووین"ی باکووری کوردستان (کوردستانی تورکیا. کەندال) بە چیایی گەورە دەورە دراوە کە دەکەوێتە ناوچەیەکی سەختەوە بەدەوری رووباری ئەفسانەیی مونزوور. لە ماوەی سەدان ساڵدا، لەم پارێزگایەدا، جۆرە کولتوورێکی کۆمەلایەتیی ئاشکرا و تایبەت گەشەی کردووە لەگەڵ هەستێکی بەهێز بۆ سەربەخۆیی خوازی. داگیرکەرە گەورەکانی وەک عەرەب و تورکە مەنگۆلییەکان، هەتا توانیبێتیان بەدەوری ئەو ماڵە هەڵۆیانەدا رۆیشتوون، ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش تەنها دەستەلاتێکی رەمزیان بەسەر ئەو ناوچەیەدا هەبووە، دەستەلاتداران سەربەخۆییەکی بەرفراوانیان بەو ناوچەیە داوە. دەوڵەتی کۆماری تورکیاش تا کۆتایی سیەکانیش سیاسەتێکی وای رەچاو کرد لەو ناوچەیەدا.

رێژیمی تورکیا دوای ئەوەی یەک لەدوای یەک ولایەتەکانی کوردستانی خستە ژێر دەستی خۆیەوە و سەرکوتی کردن، ئینجا توانی خۆی لە "کێشەی دەرسیم"، بدات. لە ٤ گوڵانی ١٩٣٧ دا، ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیا بە دزییەوە بڕیارێکی دەرکرد تا هەموو دانیشتووانی دەرسیم راگوێزێت بۆ رۆژئاوای تورکیا. ئەم ئۆپراسیۆنە (هێرشە) وەکو لێدانێک لە سەرهەڵدانە هەرێمیەکان بەدژی قانوونە سیکۆلاریەکانی دەوڵەت، ناوزەد کرا. سوپای تورکیا پەنای بۆ هەموو جۆرە کەرەستەیەکی شەڕ، بە فڕۆکەشەوە، برد تا کوردەکانی ئەو ناوچەیە راوبنێت و پاکتاویان بکات.

بیرەوەریە دەستەجەمعیەکانی کورد تا ئەم رۆژانەش کاریگەری ئەو رووداوە دراماتیکیانەی بەسەرەوەیە کە لە شیعر وگۆرانی کوردیدا، رەنگایان داوەتەوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە مێژوونووسەکانی سەر بە دەوڵەت پشتگوێی دەخەن و پەردەیەکی رەشیان بەسەردا داوە.

ئەو خزمەتە گەورەیەی کە نووسەر کردویەتی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هەموو ئەو شایەتانەی کۆکردۆتەوە کە بەچاوی خۆیان شتەکانیان بینییەوە و پاشانیش

ئـەوانـەی بـەو دیکۆمێنتانـە دەوڵـەمـەنـد کـردووە کـە بـەشـێکی زۆریـان هێـشتا بڵاونەکراونەتەوە.

حوسێن یڵـدرم، کـە خـۆی خـەڵکـی ئـەو پارێزگایـەیـە، لـە گێڕانـەوە زینـدووەکانیـدا، سەرلەنوێ، شـێوەی بیرکردنـەوە، بیروبـاوەڕە دینییـەکـان، عـادات و تـەقالیـدەکـان و کۆدەکانی شەرەف، هەروەها هونەری ژیان و مردن لەو کۆمەڵگایەدا، زیندوو دەکاتەوە کە بەگەلێک شێوە تەنهـا میراتییـەکـن لـەو عـادات و تـەقالیـدە هـەزار ساڵەیـەی کـە ماونەتەوە و لەزۆر شوێنی تر لـەنـاوچوون، یـانیش گۆڕانیـان بـەسـەردا هـاتووە. ئـەم گێڕانەوانە لەسەر قوربانیـەکـانی تـر، زیـاتر سـەرنجڕاکێشن، کـە هـەمیـشە کاریگـاری مرۆڤایەتیان لەسەر بووە و بیری تۆڵەسەندنەوە، رق و کینە و دژەڕاسیستی تـورکی و هەموو تەڵە و داوەکانی، نەکراوەتەوە. قوربانیەکان، خەم و پەژارەکان دەگێڕنەوە بـۆ نەوەکانی داهاتوو و مێژووش راستییەکانی خۆی لە شێوەی بەڵگەدا، دەرخات.

لـەم پـەیـوەندیـەدا، ئێمـا، هۆکـارێکی تـا بڵێـی بـەکـەڵکـە تـا کـورد، مێژووکـەیـان و بیرەوەرییە ناوکۆییەکانیانی لێوە بناسیت ، ئەم کتێبە کەڵکی ئـەوەی هـەیـە کـە بـۆ زمانانی رۆژئاوای وەربگێردرێت و ببێتە سەرچاوەیەکی زانیـاری بـۆ ئـەو خوێنـەرانـەی کە ئارەزوویانە لەسەر کورد و تورک زانیاریان هەبێت، وەکـو تـریش بـە شـێوەیـەکـی گشتی بۆ ئاشنابوون بە مێژووی خەباتی گەل و شێوەی بیرکردنەوەیان.

**کەندال نەزان**

## بەرکولێک

هاوینی ١٩٨٢

نیوەڕۆیە، هەتا بڵێی گەرمە، شەماڵێکی هێواش کە بەحاڵ هەستی پێدەکرێت، خشە خشێک بە سپیدارەکان دەخات کە لە گۆرانییەکی نزمی سروشت دەکات. پارێزەرەکە (نووسەر) لە شاری ئێلاگیز لە پاسەکە دێتە خوارەوە، هەروەک بەڵێنی بەخۆی دابوو، لەژێر سێبەری دارێکدا دەوەستێت تا لە رووباری مونزوور بڕوانێت. پێش ئەوەی چاوی بە دایکی بکەوێت، دەیەوێت بەشێوە تایبەتیەکەی خۆی، خۆی پاک بکاتەوە، لە نەگبەتی، رق و کینە و غەزەب، خۆی رزگار بکات. ئەو دەزانێت کە ئەو رووبارە بەدرێژایی مێژوو، هێزی خۆی پاراستووە تا هەموو ئەتککردن، بەدئەخلاقی و هەموو ئەو خوێنانەی کە رژێنراون، بسڕیتەوە. بە زەحمەت بەرەو گۆڕەپانی ناوەڕاستی شار هەنگاوی نا، هەموو گیانی لە ئارەق هەڵکشابوو، چاوەکانی نوقان تا بێتەوە سەرخۆی. بەرەو کوچەکانی گەڕەکەکەیان هەنگاوی نا، نیگای لەگەڵ دەموچاوە ئاشناکان یەکانگیر دەبوو، بەڵام هێشتا میهرەبانی خۆیان نیشان نەدابوو. کەس نەیدەناسییەوە. بیریکردەوە کە چۆن رژێمی سەربازی ترسی خستۆتە نێو دڵیانەوە:" ئەوان ناوێرن تەنانەت سلاوێکی لی بکەن کە تازە لە زیندان هاتۆتەوە". دوای ئەوەی کە دەگاتە نزیک خانوەکەیان، لە پڕ دایکی پەیدا دەبێت. وەکو هەموو ژنە پیرە کوردەکانی تر لەچکەیەکی بەسەر سەریدا دابوو. بلوسێکی سوور و پانتۆڵێکی خەتخەتی لەبەردابوو، پێدەچوو کە بە پەلە بۆلای ئەو بێت. پارێزەرەکە هەنگاوەکانی خێرا دەکات تا بیگاتێ و دەستەکانی راموسێ. بەڵام ئەو هێندە گۆڕابوو تەنانەت دایکی خۆشی نەیناسییەوە. دایکی زۆر گوێی پێنادات و بەرەو پێشەوە ملی رێگا دەگرێت. بەڵام کاتێک دەگەنە یەک بۆ سەرسوڕمانی ئەو گوێی لە پرسیارێک دەبێت:

– خوا ئاگادرات بێت! دەڵێن کورەکەم لە زیندان هاتۆتە دەرەوە، بەڵام گوایە دەوڵەت جارێکی تر گرتوویانەتەوە. ئایا هیچ شتێک لەبارەی ئەو مەسەلەیە دەزانیت؟

ئەو نازانێت چۆن وەڵامی بداتەوە، بەڵام لەپڕ شتێکی بەخەیاڵدا دێت.

— کوڕەکەت لە نێو شارە، وەرە با بچین بیدۆزینەوە.

دایکە، دڵی خۆش دەبێت.

— بەقوربانت بم، بمبە بۆلای کوڕەکەم.

بەرەو نێو شار دەکەونە رێگا، بەڵام هێشتا دە مەتر نەرۆیشتوون، عەلی خزمیان پەیدا دەبێت، تەمەنی لە حەفتا ساڵ زیاترە، لەو بەر جادەکەوە هاواری لێدەکات:

— هۆ کاک حوسێنی بەرێز!

بەخۆیی و گۆچانەکەی دەستیەوە، لە جادەکە دەپەڕێتەوە. پارێزەرەکە لە ئامێزی دەگرێت. ئیتر دایکە تێدەگات کە ئەوەی لە تەنیشتییەوە وەستاوە کوڕەکەی خۆیەتی و لە پرمەی گریان دەدات. پیاوە پیرەکە دەبینێت کە حوسێن لە رۆیشتندا نەختێک دەلەنگێت، بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە داوای لێدەکات کە پێڵاوەکانی داکەنێت تا پێکانی ببینێت. ئەو لە پرسیارەکەی تێناگات و بەڵکو لە وەڵامدا دەڵێت:

— برۆ، کەسە خۆشەویستەکەم، با بچینەوە بۆ ماڵەوە. پیاو لەم سەر جادەیە شتی وا ناکات.

پارێزەرەکە سەیرێکی دایکی دەکات کە هەموو گەڕەکەکەی بە هات و هاوار، تێگەیاندووە.

دایکە بەسیەتی. تۆ فرمێسکێک لە چاوت نەهاتە خوارەوە کاتێک لاشە رزیوەکەی باوکتمان بەخاک سپارد دوای کۆمەڵکوژییەکەی دەرسیم، ئێستا بۆچی وا بە کوڵ دەگریت؟

فرمێسکەکانی دەسرێت و دەڵێت: دەزانیت، بیستوومە کە پیاوێکی ئازایان لە زینداندا کوشتووە. وەک دەڵێن ئەو پیاوە، پیر (پیاوچاکی عەلەویەکان) عەلەویەکی خۆمان بووە.

نیگای دایکەکە لەسەر قژی کوڕەکەی دەگیرسێتەوە کە لە زینداندا، بۆز بووە، هەروەک موەکانی لاشە لاوەزەکەی. دەچنە ژوورەوە. لە ژوورە گەورەکەدا، جارێکی تر پیاوە پیرەکە بەبێ ئارامی داوا لە پارێزەرەکە دەکات:

— بۆ خاتری ئەو خوایە، گۆرەویەکانت دابکەنە با پێکانت ببینم.

کاتێک گۆرەوەیەکانی دادەکەنێت، جێگای ئەشکەنجە بە پێیەکانیەوە دیارە. خزمەکەیان کە دەموچاوە چرچوولۆچەکەی شایەتی ئەوە دەدەن کە ئەو جۆرە ئەشکەنجانەی لەسەر تاقیکراوەتەوە، بەردەوام دەبێت:

— کاک حوسێن، من ئەم جۆرە برینانە زۆر بە چاکی دەناسمەوە.

هەموو دوانیوەڕۆکە، ئەو خزمە پیرەیان باسی ئەو ناهەقیانەی بۆ گێڕایەوە کە لە کاتی سەرهەڵدانی دەرسیمدا لێیان کرابوو. پاشان خواحافیزیان لێدەکات:

— کاک حوسێن، تۆش ماندوویت، پێویستیت بە حەسانەوە هەیە، دوایی دێمەوە بۆلات.

بەرەو ماڵ، دەکەوێتە ڕێگا.

بەڵام، پارێزەرەکە، ناتوانێت بیر لە زیندانی دیاربەکر نەکاتەوە، بیرەوەریەک کە لە ماڵیشەوە لەیەخەی نابێتەوە. تەواو شەکەت و ماندووە، هەموو گیانی بەهۆی پاشماوەی ئەشکەنجەدانەوە، دەکزێتەوە. کاتێک بەتەنیا لەگەڵ دایکی دەمێنێتەوە، لە پڕ وادەزانێت لە دۆزەخەوە هاتووە بۆ ئەو بەهەشتەی، کە لای دانتێ (Dante) شکڵی گرتبوو.

قاچەکانی هێندە لاواز بووبوون کە بەحاڵ دەیانتوانی هەڵیبگرن.، چاوەکانی نەخۆش کەوتبوون، ملی باریک و روومەتەکانی تێک قوپابوون، ئەوەش بەقەد دایکی خەمباری دەکات کە لێی ناپرسێت چی بەسەرهاتووە یانیش بۆ وا لەڕو لاواز بووە. نیشانەکان، نیگاکان و هەڵسوکەوتەکان بۆخۆیان قسە دەکەن، ئەوەی کە دایکە بیستبووی لەماوەی ئەو یانزدە مانگەی کوڕەکەی لە زینداندا بوو، وای کردبوو کە خوێن لە دەمارەکانیدا بیبەستێت.

وەکو تریش، شتێکی گونجاو نەبوو کە پارێزەرەکە دانیشێت باسی ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەیەی کە کێشابووی، بگێڕێتەوە. کاتێک سەیری دایکی دەکات وا بە بێدەنگی دەگری، بیر لەو هەزاران ژنانە دەکاتەوە و بەخۆی دەڵێت:" نابێت ئەوان

ئاوا عەزاب بچێژن، نابێت چیتر فرمێسک و خوێن بڕژێن". بەڵام ئەو هیچ وشەیەک شک نابات کە دڵنەوایی دایکی پێ بکاتەوە، بۆیە دەچێت بۆ ژووره گەورەکە.
خانوەکانی تونجەلی (دەرسیم)، بەشێوەیەکی مۆدێرن فەرش کراون. مێزێک کە لە دار گوێز دروستکرابوو تەپڵەکێکی جگەرەی مەرمەڕی لەسەر بوو لە سەر فەرشێک کە لە (Kemah) لەسەر شێوەی کۆنی کوردی دروستکرابوو، دانرابوو. قەنەفەکان لە مەخمەری سوور هەڵکێشرابوون. بە دیوارەکەدا، وێنەیەکی ناوچەیەکی دەرسیمی هەڵواسرابوو، فیشەک لەغێک کە گوللەی گەورەی پێوە کرابوو بە بزمارێکی زەرد لەسەر تابلۆیەک هەڵواسرابوو کە دیمەنی سەرچاوەکانی مونزووری نمایش دەکرد. دەچێتە بەردەمی کتێبخانەی براکەی کە ئەویش هەر پارێزەر بوو، کتێبێک دەردەهێنێت بە ناوی "سەرهەڵدانی کوردان لە ئەرشیڤی ستادی جەنراڵەکاندا" و لەسەر قەنەفەیەکی قەڵەو دادەنیشێت. ئەوە یەکەمین جارە ئەو بەرهەمەی کەوتبێتە دەست کە لەسەر بناخەی دۆکیومێنتە نهێنیەکان نووسراوە و بەسەر سوڕمانەوە دەکەوێتە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی. لەپڕ چاوی بە سەردێڕی یەکێک لە پاشکۆکان دەکەوێت و دەست دەکات بە خوێندنەوەی. بەیاننامەیەک لە ئەنجومەنی وەزیرانەوە لەمەڕ هێرشێک بەناوی "پاکتاوکردن" کە لە ساڵی ۱۹۳۷ لە دەرسیم دەستی پێکرا:

**زۆر نهێنی**

**بەیاننامە**

**٤ ی مای ۱۹۳۷**

**نووسینگەی سەرۆک وەزیران**

**هێڵی گشتی**

لەسەر ئەو ڕاپۆرتانەی کە لە پەیوەندی لەگەڵ سەرهەڵدانەکانی ئەم دواییەی هەرێمی تونجەلی (دەرسیم) ئامادەکراون، بە ئامادەبوونی ئەتاتورک و سەرلەشکری سوپا، لێکۆڵینەوە و گوفتوگۆیان لەسەر کراو ئەم بڕیارانە دران:

١. دەبێت، ئەو هێزە چەكدارانەی كە یەكیان گرتووە، لە هێرشێكی بەهێز و بەكاریگەردا، خۆیان بگەیەننە هێڵەكانی نازمییە، كێتچیزە كەن (ئاساگی بۆر)، سێنە و كارۆگلان.

٢. دەبێت ئەمجارە دانیشتووانی ئەو ناوچە راپەڕیوانە بگوێزرێنەوە بۆ جێگایەكی تر {...}، دەبێت لە هێرشەكانی سەر گوندەكاندا، دەستبگیرێت بەسەر هەموو چەك و تەقەمەنییەكدا و دانیشتوانەكەیشی رابگوێزرێن. دەوڵەت حسابی ئەوە دەكات كە دەستبەجێ، دوو هەزار كەس بگوێزرێنەوە.

دەوڵەت لەسەر ئەو بڕوایەیە كە لە هێرشێكی سووك دا، بتوانرێت سەرچاوەی راپەریوەكان بێكاریگەر بكرێت. بەمانایەكی تر لە لایەك كاریگەری ئەوانەی كە چەكیان هەڵگرتووە نەهێڵێت، لە لایەكی تریشەوە بە شێوەیەكی سیستەماتیك گوندەكان كاول و خاپوور بكرێن و خێزانەكانیش پەراوەزە بكرێن.

لەسەر ئەو بنەمایەی كە ئێستا لە بەرەكەدا، هێزە پەرەوەردەكراوەكانی مالاتیا و ئانكارای لێن، لە رێگای چالاكییە موخابەراتییەكان لە ناوچەكە و رێكخستنی بەتالوێنیك كە لە دیاربەكراوە رەوانەی ئەوێ دەكرێت، دەبێت لەماوەی یەك هەفتەدا، واتە ١٢ی مای ١٩٣٧، دەست بە هێرش بكرێت.

تێبینی: پێویستە بە هەچ نرخێك بێت، خەڵكێكی زیاتر كارا بكرێت، بە قازانجی خۆمان، دەبێت كەڵك لە گرووپەكانی ناوچەكە وەربگیرێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە دەبێتە هۆی ئەوەی بودجەیەكی زیاتر تەرخانبكەین.

پارێزەرەكە هەست بە دەركردنی ئارەقێكی سارد دەكات. بەراوردێكی باری نائاسایی ساڵی ١٩٣٧ لەگەڵ ئەوەی ئێستا ١٩٨٢ دەكات. بیر لە هاورێكانی دەكاتەوە كە هێشتا لە دۆزەخی زینداندا ماونەتەوە، ئەوانەی بوونەتە قوربانی قانوونە نوێیانەی كە تازە دەركراون بەڵام هیچیان لە قانوونە كۆنەكانی پێشوو كەمتر نییە. دەنگێك كە لە چێشتخانەكەوە دێت، تەلاری بیركردنەوەكانی دادەرمێنێت. هەست دەكات كە چۆن كەمێك خەمگین بووە. گورێك بەخۆی دەدات و هەڵدەستێتەوە و بەرەو دەرگاكە دەچێت. سەیر دەكات ئەوە ئێما لەنگە (ئێما شەلە) بەخۆی و پرچە تەواو سپی و

دەموچاوە چرچ هەڵاتووەکەیەوە. تف لە قورگیدا وشک دەبێت. ئەوەی کە لە هەمووی زیاتر کار لە مرۆڤ دەکات، دەستە لاوازەکەی ئێمایە، کە هەر لە منداڵییەوە زیادی نەکردووە و وەکو پارچەیەکی بێگیان پێیدا هەڵواسراوە. چاو لە چاوی پارێزەرەکە دەبڕێت، بەڵام ئەو ناتوانێت لەسەر ئەو قاچەی بووەستێت کە ئیفلیچ بووە. بەیارمەتی قاچەکەی تری دەتوانێت بەلانسی خۆی رابگرێت. دەموچاوی وەکو بەردێکی رەقی لێهاتبوو، چاوەکانیشی کزو داماو بووبوون. سەرپۆشێکی سپی دابوو بەسەریا و کراسێکی ئاوادامانی ئاڵو واڵای لەبەردابوو.

پارێزەرەکە نەیتوانی چیتر لەوە زیاتر چاوەڕێ بکات. بەرەو پیری چوو، ماچی کردو و پاشان دەستی گرت و چووە ژێر باڵی تا لەسەر قەنەفەکە دابنیشێت. یەک وشە لەدەمی ئێماوە نەهاتە دەرەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە چاوی لەسەر پارێزەرەکە هەڵنەدەگرت. بۆ ئەوەی لەو حاڵەتە رزگاری بێت، پارێزەرەکە بەشێوە زاراوەی دەرسیمی، زازاکی، لێی پرسی حاڵ و ئەحواڵت چۆنە؟ ئاخر، ئێما تورکی نازانێت و زۆر چارەی ئەوانەیشی ناوێت کە بەو زمانە قسان دەکەن.

– من باشم، ئەی بۆخۆت چۆنیت؟ خوا دەست بە باڵتەوە بگرێت و لەهەموو دەرد و بەڵاو لە زاڵمان و کارو کردەوەیان بتپارێزێ.

بێگومان، پارێزەرەکە پیشتر گوێبیستی ئەو بەسەرهاتە ببوو، کە ئێما دەربارەی سەرهەڵدانەکەی دەرسیم و ئەو چەوساندنەوە زاڵمانەیەی بەدوای ئەو رووداوەدا بەسەریان هاتبوو باسی کردبوو. هەندێک لە رووداوەکان وایان لێدەکرد کە بیربکاتەوە و هەندێک جاریش، بە رووداوە بچکۆلەکان پێدەکەنی. بەڵام لەدوای زیندانی دیاربەکرەوە، ئۆقرەی لێ هەڵگیرابوو، دەیویست بچووکترین شت لەسەر ئەوەی کە چی لە دەرسیم روویدابوو، بزانێت.

ئێما، کلیلی کردنەوەی زۆرێک لە نهێنییەکانە، بۆیە دەیەوێت بەهەر نرخێک بووە، کارێک بکات، کە سیقە لای ئێما پەیدا بکات. ئاخر، ئەو شارەزایی لەسەر بەشێک لە مێژووی ئێما هەبوو، بەڵام زۆر لایەنی تری ژیانی ئەو هەبوو کە هیچی لە بارەیەوە نەدەزانی. هەتا ئەو کاتەش، ئێما ئەو نهێنیانەی وەکو شتێکی شەخسی خۆی تەنها

لای خۆی هێشتبووەوە. هەرکەسێکیش باسی ئەو مەسەلەیەی بکردایە، ئەو خۆی لێ کەڕو کاس دەکرد.

پارێزەرەکە، زۆر بە کورتی و بە چەند وشەیەکی سادە باسی ئەو ماوەی کە لە زیندانی دیاربەکر بەسەری بردبوو بۆ ئێما کرد و پرسیارێکی ئاراستە کرد: دەمەوێت داوای شتێکت لێ بکەم. ئەگەر منت خۆش دەوێت و دەتەوێت چاک ببمەوە، ئەگەر هیچ نرخێک بۆ خزمایەتیەکەمان دادەنێیت و دەتەوێت خوا رەحم بە دایکم بکات، ئەوا دەبێت قسەم بۆ بکەیت. ئێما کەمێک بیر دەکاتەوە.

— باشە، پێم بڵێ دەتەوێت چی بزانیت، ئێما دەڵێت.

— بەڵێنم پێ دەدەیت کە وەڵامم بدەیتەوە؟ پارێزەرەکە بە گومانەوە لێی دەپرسێت.

— ئا، بەڵێن بێت، ئەگەر بتوانم.

پارێزەرەکە، زەردەخەنەیەکی بۆ دەکات و دستەبەجێ جانتا دەستییەکەی لەژێر میزەکەدا، دەردەهێنێت، دەفتەرێک و قەڵەمێک دەردەهێنێت و دەیخاتە سەر ئەژنۆی. سەیرێکی دەموچاوە بێگەردەکەی دەکات.

— چیت بەسەر هاتووە هەموویم بۆ بگێرەوە، باسی هەموو ئەو شتانەم بۆ بکە بە چاک و بەخراپ کە بەناچاری بەسەریاندا هێناوی. ئەوەی کە دەیزانێت بەبێ دوودڵی و شەرم کردن یانیش وا هەست بکەیت کە ناڕەحەتت دەکات.

پاش تۆزێک، ئێما، بە پەشۆکاویی و بە بڕوا بەخۆبوونەوە دەڵێت:

— ئەوەی کە تۆ دەتەوێت بۆت بگێڕمەوە، گرنگترین شتە کە بەسەرم هاتووە. من دەمەوێت کە ئەم دنیایەم بەجێهێشت، ئەو نهێنیانەش لەگەڵ خۆم بەرمە ژێر گڵەوەو لای کەس باسیان نەکەم. بەڵام تۆ دەمارێکی لاوازی منت گرت، ئاخر تۆ دەزانیت کەمن چەندەم تۆ خۆش دەوێت!.

لەبیرتە کە من بۆ دڵنەوایی کردنی تۆ، بە دڵێکی پڕ لە خەفەتەوە، دەستە بچکۆلانەکانی تۆم ماچ کرد تا داوای لێبووردنت لێ بکەم. پێش ئەوەی بتگرن و بتبەن بۆ زیندانی دیاربەکر، زۆر گوێت بە رابردووی من نەدەدا. ئێستاش کاتێک تۆ

پرسیاری ئەوەم لی دەکەیت، ئەوا منیش هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە. تەنها شتێک هەیە کە نازانم لە کوێوە دەست پێبکەم.

— پارێزەرەکە بە چرپەیەک پێی دەڵێت، لە سەرەتاوە.

ئێما، بە ئێش و حەسرەتەوە، بیر لەسەردەمی سەرەتای لاوێتی خۆی دەکاتەوە، بەم شێوەیە دەست بە گێڕانەوەکەی دەکات.

# بەشی یەکەم

## گالبووسان

### ١

براکەم، دەست بکە بە نووسین و داوام لی بکە بە وردی رووداوەکانت بۆ باس بکەم، دەبێت ئەوە بزانیت کە من هێشتا بیرو هۆشم لە دەست نەداوە. ئەوەی کە بینیومە، بیستوومە و خۆم لەگەڵیدا ژیاوم، هێشتاش هەمووی لە نێو دڵ و دەرونمدا دەژی. با لەسەرەتاوە باسی سەردەمی منداڵی خۆم و گوندەکەمان، گالبوسانت بۆ بەکەم.

ئەگەر بیروهۆشم خیانەتم لێ نەکات، ئەوا لە مانگی ئۆگۆست (ئاب)ی ١٩٣٨ لە گوندەکەمان دەژیام. هەر وەک خۆشت دەزانیت، گوندەکەمان، لە دامێنی ئەو شیوو دۆڵەی کە لە قەراخ ئەو ئاوەی بەخوڕ دەهاتە خوارەوە، کە هەمان ناوی هەبوو، واتە گالبوسان، هەڵکەوتبوو. حوسێن باری بەرانبەری ئێمە لەوبەر کەنارەکەوە دەژیا. سەییت باکیل و کاک عەلی بەرتی لە نزیک ئێمەوە لە قەراخ ئاوەکەدا دەژیان. لە نێوان ئەو دوو خانووەدا، چەمێک بەخوڕ دێتە خوارەوە. ئەو ئاوە لە شاخی سپییەوە دێتەوە خوارەوە، هەر لەوێش ئاشێکی لێ بوو، بە شەو و بە رۆژ، ئیشی دەکرد.

دراوسێی هەرە نزیک لە ئێمەوە خدری سەیید باکلیسی بوو.

(ئیسا ئیڤشی) و (خیدە ئیش) نەختێک لەو لاترەوە دەژیان. کەمێک لە خوارترەوە، کانیەکی ساردی لێ بوو بەناوی هینی ساردین، کە لە نێو تاشە بەردەکانەوە دەهاتە دەرەوە. ئاوەکەی هێندە ساردبوو کە کەس نەیدەتوانی، یەکسەر، قومێکی لێ بخواتە. گوندەکەمان پاڵی بە شاخی زاگرۆڤیتەوە دابوو و چواردەوری بە دارستانێکی چڕ گیرابوو، کە لەلایەن دانیشتوانی گوندەکەوە پێیان دەوت دارستانی زاگرۆڤیت.

لەم بەر رووبارەکەوە واتە بەبەری لای ئێمەوە، دارستانێکی چڕی هەمە رەنگە هەڵچوو بوو، کەچی سپیدارەکانی ئەو بەر رووبارەکە وایان نیشان دەدا کە سەریان لە ئاسمان گیر کردبێت. با، بە هێواشی دەیلاراندنەوە. لە پشت ئەو دارانەوە، ئاشێکی تری لێ بوو کە بە ئاوی رووباری گالبووسان کاری دەکرد. پیرەکان دەیانگووت کە ئەو ئاشە لەسەردەمی ئەرمەنییەکاندا دروستکراوە. لە پشت خانووەکەی حوسێن باریسەوە،

دەتوانرا ئەو خانوانە ببینرێن کە هی (دۆیە قەر)، مستەفایا دەروێش و حوسێن تووسیک بوون. بە تەنیشت خانووەکەی تووسیکدا، چۆگەیەک بە خوڕ دەهاتە خوارەوە کە پێیان دەووت رووباری حوسێن تووسیک.

رووباری گالبووسان، ئاویی زەوییەکانی ئێمەی دەدا، هەرچەندە زۆریش نەبوون بەڵام هەتا بڵێی بەپیت و بەرەکەت بوون و بەشی هەموو پێداویستییەکانی ئێمەی دەکرد، لە گەنم، جۆ، هەرزن، بیبەر، تەماتە، ئارو (خەیار)، سیر و پیڤاز. بزنەکانیشمان خۆیان بە گەڵای داربەڕووەکان تێر دەکرد.

گوندی گالبووسان خۆی بە لووتکەکانی چیایی زارگۆڤیتەوە هەڵواسیبوو، کە لێوەی بەباشی دەشتی پیرگیدی دیار بوو، کە خۆی درێژ دەکردەوە هەتا دەگەیشتە چیای پولێ سۆبوونی.

لە پایزاندا، کاتی دەغڵ و دان هەڵگرتن، هەردوو ئاشەکە دەبوون بە یەکێک. خەڵکی ئەو دەڤەرە، بەشەو بەڕۆژ دەهاتن بۆ هاڕینی گەنمەکانیان و پاشان بە خۆیان و فەردە ئاردی پڕەوە دەگەڕانەوە.

بە بەهاران، گژوگیا و گوڵ، بە بەرگی ئاڵاو واڵایانەوە، ناوچەکەیان دەڕازاندەوە، هەموو شتێک لە جوانیدا نقووم دەبوو. ئێمەش بە بۆنی ڕێحانە، گوڵەوەنەوشە و نێرگز، مەست دەبووین. پەپوولە و مێش هەنگەکان بەبێ ماندوو بوون، لەم گوڵەوە دەفڕین بۆ ئەو گوڵ، لە کاتێکدا کە بوولبول و چۆلەکەکان بە ئەسپایی دەیانخوێند.

بۆ ئێمەی منداڵان، وەرزی بەهار، مانایەکی تایبەتی هەبوو. هەر لە بەیانی زووەوە دەچووینە دەرەوە تا چاودێری مەڕ و بزنەکانمان بکەین کاتێک دەمانبردن بۆ ناو دارستانە چڕوپڕەکان. یاری (عەلی فاتیک)مان دەکرد کە ئاوهابوو، یەکە یەکە پەڕەکانی گوڵێکمان لێدەکردەوە هەتا دواپەڕەکەی، پاشان یەک بەدوای یەکدا دەمانگووت "براوە" یان "ون بە".

تاجە گوڵمان دابەشدەکردو بەیارمەتی شیلەی گوڵە کەنگری کێویی دەمانکرد بە بنێشت. کاتێکیش لەسەر هەندێک بەرد دەمان ماڵینەوە، دەستەکانمان ڕەنگی ئەوانیان دەگرت.

کاتمان بە سێبەری خۆمان دەپێوا و بەبێ هیچ دەردەسەرییەک خواردنمان بەدەست دەخست، ئاخر ئێمە دەمانزانی کام گژوگیا ژەهراوییە.
پێش رۆشتنەوەمان بۆ ماڵەوە، کاتێک خۆر ئاوا دەبوو، دەچووین بۆ سەر رووبارەکەو کەمێک یاریمان دەکرد.
من تاکە کچی دایک و باوکم بووم، هەربۆیە هەموویان بە براکانیشمەوە وەک پەرستن دەیانپەرستم و هەموو خۆشەویستی خۆیان بەمن دابوو. هەتا بڵێی ژیکەڵە بووم، قژێکی درێژ و دەمووچاوێکی خڕ و کوڵمەکانیشم سوور دەچوونەوە، هەربۆیە زۆرجار دەبووم بە جێگای قسەوباسێکی زۆر.
وەک دەڵێن، دوای ئەوەی هەر شەش براکەم بەدوای یەکدا لە دایک دەبن، رۆژێک دایک و باوکم لە دەمەوخۆرائاوبونێکدا روو دەکەنە خۆر و دەستیان بەرەو ئاسمان بەرزدەکەنەوە و دەپاڕێنەوە کە کچێکیان ببێت.
دەچنە زیارەتی زۆر چاک و پیران لە نێویاندا، دایە فاتمە و لەوێ خێرێک دەکەن. وەک دەڵێن کە دوعاکانیان قبووڵ دەبێت، من لە دایک دەبم.
باوکم، حوسێن، پیاوێکی لەڕو لاواز و باڵا مامناوەندی بوو، هەمیشە دەم بە پێکەنین و رووخۆش بووە، زۆر بە منداڵەکانیەوە پەیوەست بووە و پیاوێکی بە ئیعتیبار و لەگەڵ دراوسێکانیدا بە چاکی هەڵیکردووە. سمێڵەکانی درێژ و برۆکانیشی پڕ و ئەستوور بوون. ئەو هێشتا منداڵێکی بێ چارەی تەمەن شانزدە ساڵان دەبێت کە لەگەڵ دایکم زەماوەند دەکات کە ژنێکی کامڵی نزیکەی بیست ساڵان دەبێت. وەکو گاڵتەکردن دەڵێن کە ئەو لە تەمەنی لاوێتی و تازە زاوەیەتیدا، نەیوێراوە بچێتە ژووری (بووک)ێوە. رۆژێکیان ئەوان لە قەراخی چۆمەکە دەبن و لە دووری هەموو نیگایەک دەست دەکەن بە دەستبازیکردن. دوای ئەوە، دایکم توورە دەبێت و تاشە بەردێک دەخاتە سەر سنگی و دەیبەستێتەوە و هەڵی دەداتە ناو ئاوەکەوە، بەڵام کەس نازانێت بۆ چی وای کردووە. بە تەنیا دێتەوە بۆ ماڵەوە. حەتمەن دانیشتووانی گوندەکە پێوەی دەنێن بەڵام ئەگەر مرۆڤ پێیان باوەر بکات ئەوا نە دەبوو بەردەکەی لەسەر لابەرن هەتا نەبوایە بە زاوا.

ئەگەرچی خانووەکەمان یەک قات بوو بەڵام زۆر گەورە بوو. لە دوو بەش پێکهاتبوو، ئەو بەشەی خۆمان تێدا دەژیاین لەگەڵ تەویلەیەک. ئەو شوێنەی خۆمانی لێ دەژیاین لە هەیوانێک پێکهاتبوو کە دەکەوتە نێوەندی خانووەکەوە، ژێر زەمینێک و چوار ژووری نووستنی تێدابوو. دیوارەکانی لە بەرد دروستکرابوون و بە قوڕ سیواخ درابوون. براکانم، سلێمان و کامێر و مەمەد، ژنیان هێنابوو و منداڵیشیان هەبوو. هەر بۆیە هەتا دەهات ژمارەمان زۆرتر دەبوو و جێگاشمان تەنگتر دەبووەوە.

وەکو دوێنێ وایە لەبەر چاومدا. من لەگەڵ براکانم، موسا، داود و حوسێن و حەسەن عەلی، لە هەیوانەکدا دەنووستین. دیارە حاڵمان زۆر باش نەبوو بەڵام ژیان بەرەو پێش دەچوو، هەروەها بەو حاڵەوە نەماینەوە.

بەهاتنی سەربازەکان بۆ ناوچەی دەرسیم، تا دەهات خەڵکەکە نیگەران تر دەبوون. ژەنراڵێک فەرمانی دابوو کە دراوسێکەمان کە ناوی خدر بوو ببێتە کوێخا، بۆیە دەبوو زوو زوو سەردانی گارنیسۆر بکات. بەو شێوەیە هەواڵی شەڕەکانی دەوری (رووباری لاش)مان بیست، لە دێمانان. هەواڵی کوشتنی ماڵباتی سەید رەزاو، تەفروتوناکردنی پیاوەکانی بەختیاری، خزم و کەسووکار و دراوسێکانمان و سەربڕینی ئاغا شان، قیامەتی هەستان و بووە باسوخواسێک کە هەمیشە باسی لێوە دەکرا و هەموو گوندنشینەکانی هەژاند. پیاوانی بە هەیبەتی وەکو سەید باکیل، کاک عەلی بەرتی و حوسێن باری، ئاگادرای هەموو شتێک بوون. ئەوان بە شێوەی جۆراوجۆر پەیوەندیان لەگەڵ پیاوانی بەدەستەڵاتی ناوچەکانی دەرسیمدا هەبوو.

بەو شێوەیە رۆژە رەشەکە هات. نیوەڕۆ بوو، خۆر بە بەرزییەوە لەسەر خانووەکەمان وەستابوو. رۆژێکی خەفە کراو بوو، گوێمان لە دەنگی سیسرکەکان بوو. سەگەکەمان، سیتچۆ، کە تووکێکی سپی و دوو گوێی قوتی پێوە بوو، لەو سێبەرەی کە من یاریم تێدا دەکرد، لێی راکشابوو. تازە دایکم قژیی بۆ شانە کردبووم و مووروی سوور، شین و زەردی بە کەزییەکانمەوە کردبوو. لەپڕ گوێم لە سیتچۆ بوو دەستی کرد بە وەڕین و هەڵبەزو دابەز. زۆر نیگەران بووم و هەستامە سەر پێ. سەگەکە لە وەڕین بەردەوام بوو و بەرەو لای رووبارەکە رایکردو منیش بەدوای کەوتم. لەوێ، لەوبەر

رووبارەکەوە چاوم بە حوسێن توسکی و سەدان سەرباز کەوت، بە خۆیان و چەکەکانیانەوە کە سەرەنێزەیان پێوە بوو. زۆربەی سەربازەکان پیادە بوون، بەڵام ئەفسەرەکان بە سواری ئەسپ و هێسترەوە بوون. بەرەو گوندەکەمان دەهاتن و پیاوانی دەرەلنگ فشی دەرسمییان پێش خۆیان دابوو و پاڵیان پێوە دەنان. کە ئەوەم بینی تۆقیم، بەرەو ماڵەوە رامکرد، بینیم دایک و باوکم و براو برازنەکانم خەریک بوو دەهاتنە دەرەوە. رامکرد بۆ لای دایکم و خۆم کرد بەژێر کراسەکەیدا و دەستم کرد بە گریان.

سولێمان کە پیاوێکی پیر بوو، رووی کردە باوکم و پێی وت: دەبێت تۆش لەگەڵمان بێیت.

باوکم خەریک بوو بۆی روونبکاتەوە کە نایەت:

— من ناتوانم ژن و منداڵاکان بەجێ بهێڵم بۆ ئەو غەزەبانە. من پیربووم و ئەوان هەقیان بەسەر منەوە چییە. ئێوە بڕۆن! خۆتان رزگارکەن، من ئاگام لە ژن و منداڵەکان دەبێت.

حەسەن عەلی کە لە هەموان گەنجتر بوو لەگەڵ ئێمە مایەوە، بەڵام هەر شەش لە براکانی ترم و دوو لە برازنەکانم خۆیان کرد بە نێو دارستانی زارگۆڤیتەوە کە کەوتبووە پشت خانووەکەمانەوە. دراوسێکانیشمان، پیاوەکانی ماڵی ئیڤیش، کە بینیان چۆن ئەوانەی ئێمە رۆیشتن ئەوانیش شوێنیان کەوتن. کە سەربازەکان هاتنە نێو ئاواییەوە، سەید باکلی، شەمۆی لای حوسێن توسکی و بەکۆی لای کاک عەلیش، هەموویان بەرەو دارستانەکە رۆیشتن. ئەوەی لە ئاواییدا مابووەوە، تەنها ژن و منداڵ و پیاوە پیرەکان بوون. دایکم دەستی کرد بە گریان و ئەو برازنانەشم کە مابوونەوە دەستیان کرد بە رنینەوەی قژی خۆیان، سەگەکەمان، سیتچۆ، هێشتا لای رووبارەکە بوو، بە بەردەوامی دەیوەڕاند. لە لای ئێمەوە ئەوبەری رووبارەکەمان لێوە دیاربوو. سەربازەکان چواردەوری خانووەکانیان گرتبوو و تا هەموو خەڵکەکە ناچاربکەن بێنە دەرەوە. گریان و شیوەنی ژنان و منداڵان دەگەیشتە لای ئێمە. راستییەکەی، ئێمە

نەماندەزانی چیمان لی دەکەن. بەڵام لەوە تێگەیشتبووین کە دەیانەوێت هەموو پیاوەکان کۆبکەنەوەو و لەگەڵ خۆیان بیان بەن.

کاتێک سەربازەکان پەڕینەوە و بەرەو لای خانووەکەی ئێمە هاتن، باوکم وتی با بڕۆینە ژوورەوە، دایکم دەرگاکەی پێوەداو ئێمەش هەموو خۆمان ترنجاندبووە لای پەنجەرەکەوە تا ببینین چی ڕوودەدات.

یەکە یەکە هەموو خانوەکانیان گەمارۆ داو خەڵکەکەیان بە دەست بەرزکراوەیی بەزۆر دەهێنایە دەرەوە. بە ریز ڕوویان لە دیوارەکان دەکردن و دەستیان دەکرد بە پشکینی خەڵکەکە. پاشان کەوتنە پشکنینی ماڵەکان.

بەوشێوەیە سەرە گەیشتە سەر ماڵی ئێمە. کە لە دەرگایان دا، باوکم دەرگاکەی کردەوە، بە خۆیان و تفەنگەکانی دەستیانەوە خۆیان کرد بەژووردا، بە زمانی خۆیان کە بۆ ئێمە بێگانە بوو و لێیان تێنەدەگەیشتین، دەستیانکرد بە هاوار بەسەرماندا. نەماندەزانی چیان لێمان دەوێت. باوکم وتی، دەستان بخەنە سەر سەرتان و بڕۆنە دەرەوە. براژنەکەم منداڵاکانی کردە کۆڵی و دەستی گرت بە لەچکەکەکەی سەریەوە. لە دەرەوە هەموومانیان ریز کردو ئەفسەرێک کە بەسواری ئەسپێکەوە بوو، فەرمانی بە سەربازەکاندا کە بمانپشکنن. کە هیچیان نەدۆزییەوە، جارێکیتر چوونەوە بۆ نێو خانووەکەمان. نیو سەعاتێکی پێچوو، تا هاتنە دەرەوە و دەستیان بە پرسیارکردن لە باوکم کرد، ئەویش واقی ورمابوو و نەیدەزانی وەڵامیان بداتەوە، ئاخر ئەو لە زمانی تورکی نەدەگەیشت. وەرگێڕێکیان هێنا، لە باوکمیان پرسی کوڕەکانت لە کوێن؟ باوکیشم لە وەڵامدا وتی: نازانم. ئیتر دەستیان بە لێدانی باوکم کرد، تا سوارێک هاتوو دەستی گرتن. دوای ئەوە دەستی باوکمیان گرت و لەگەڵ خۆیان بردیان. ویستم دوای باوکم بکەوم، ئەوەندەمزانی دایکم قژی گرتم و وەستاندمی، نەیهێشت شوێنیان کەوم. لە خانووەکەمان دوور کەوتینەوە تا لە چاومان ون نەبن، پیاوەکانیان لەگەڵ خۆیان بەرەو لای خانووەکەی باکیل برد. دایکم دەستی بەلاواندنەوە کرد و یەکە یەکە ناوی ئەو پیاوانەی دەوت کە سەربازەکان لەگەڵ خۆیان بردبوونیان: مستەفایا دەروێش، داڤوتا قەر و حوسێن باری، هەروەها

سلویا گولوری و خیدە کاک، کە بە ڕێکەوت لەناو دێکەدا بوون. سەربازەکان پیاوەکانیان بەرە و لای زێی (OKH) وە دەبرد تا لەگەڵ پیاوەکانی دێکانی دەورو پشتماندا، کۆیان بکەنەوە و لێیاندا و ڕۆیشتن.

کاتێک گەڕاینەوە بۆماڵەوە چیمان بینی، هەموو شتەکانمان درابوو بەسەر یەکدا، دایکم دەستی بە دوعا کردن لە سەربازەکان کرد: دەک ڕەبی دەست و قاچتان شکێ! یاخوا ماڵتان ئاگری تێبەربێ! بەر نەفرەتی ڕۆژ و دوزگوون بابا کەون کە ئێمە بە پشت و پەنای خۆمانیان دەزانین.

هەچی ئاردمان هەبوو هەموویان هەڵڕشتبوو، گوێنیەکانیان هەڵدڕی بوو و لە هەیوانەکدا هەڵیان ڕشتبوون. هیزە ڕۆنەکانی دایکمیان هەڵدڕیی بوو و ڕۆنەکیان کردبوو بەسەر ئاردەکەدا. هەروەها فەردە سیر و پیڤازەکانیشیان دڕاندبوو بەسەر دۆشەکاندا هەڵیانڕشتبوون، هەرچی جلێکمان هەبوو هەموویان بەو ناوەدا بڵاوکردبووەوە و قاپ و قاچاخەکانمانیان شکاندبوو. کاتێک دایکم و براژنەکانم ماڵەکەیان بەو شێوەیە بینی، دەستیان بە گریان کرد، ئێمەی منداڵیش بەدوای ئەواندا دەستمان بە گریان کرد. دوای تاوێک دایکم داوی لە براژنەکانم کرد کە فرمێسکەکانیان بسڕن و بێن یارمەتی بدەن تا شتەکان کۆ بکەنەوە. بەدەم کۆکردنەوەی ماڵەکەوە بە بەردەوامی دایکم دوعای لە سەربازەکان دەکرد. کە ماڵەکەمان کۆ کردوە ئێمەش چووین بۆ لای ئەو خەڵکەی کە لای ماڵی سەید باکیلس کۆبووبوونەوە.

هەموو ژنی ئاوایی لەوێ بوون. بەسێر خاتوون کە ژنی سەید باکیل بوو وتی: سەربازەکان بەدوای چەکدا دەگەڕان، دوای ئەوەی لێکۆڵێنەوە لەگەڵ پیاوەکانمان دەکەن بەریان دەدەن. بەڵام ژنەکەی دۆیا قەر، یەکە یەکە ئەوانەی دەژمارد کە لە هێرشەکانی پێشووتردا لەگەڵ خۆیان بردبوونیان. چەکێ کە ژنی حوسێن باری بوو قسەکەی لەدەم وەرگرتەوە: ئەوانەی ئێمە ساڵێک دەبێت چەکیان داناوە و کەس لەم دێیەی ئێمەدا هیچ بەربەرەکانیەکی لەگەڵ سەربازەکاندا نەکردووە، کەواتە نابێت ئێمە خۆمان وەکو باڵندەیەکی بەدبەخت نیشان بدەین، خەمتان نەبێت پیاوەکانمان

دەگەڕێنەوە. بەڵام ئەم قسانەی چەکێ وایان نەکرد کە قەناعەت بە هاسیل بابا کوڕی سەید باکلی بکات کە سەرەڕای ئەوەی تەمەنی نۆزدە ساڵ بوو سەربازەکان لەگەڵ خۆیان نەیانبردبوو، ئاخر ئەو قاچێکی ئیفلیج بوو. ئەو پێی وابوو کە چەکێ عەقڵی مندالانەیە:

– دیارە پیاوەکانی بەختیاری، چەکیان هەڵگرتبوو، بەڵام ئەی بۆ ژن و منداڵەکانیان کوشتن؟ خۆ ئەوە ئەگەر هەر باسی کۆمەڵکوژییەکەی ماڵی سەید رەزا نەکەین، کە چل کەسی بێ چەک و بێتاوان بوون؟

ژنەکەی موختار تێڕوانینێکی تری بۆ مەسەلەکە هەبوو:

– ئێمە نابێت پیاوەکانی خۆمان لەگەڵ سەید رەزا تێکەڵ بکەین؟ ئەو بەربەرەکانێی سەربازەکانی دەکرد. هەمووی خەتای ئەو بوو کە سوپا رووی کردە دەرسیم.

ئەم قسانە وای کرد کە چەکێ بە رووی ژنەکەی موختاردا هەڵشاخێ:

– کچێ لە خوا بترسە! ئا بەو شێوەیە باسی سەید رەزا نەکەی! ئەو هەموو خزمەکانی خۆی کرد بە قوربانی دەرسیم.

بەسەر خاتوون، تێکەڵاوی قسەکانییان بوو:

– ئێستا بڕوانن! بۆ لەگەڵ یەکتری شەڕ دەکەن؟ کەمێک سەبرتان هەبێت. ئێمە دەبێت تەنها لە خودا بپاڕێینەوە.

کە هەموو شت هێور بووەوە هاتینەوە بۆ ماڵەوە. هێشتا تاریک دانەهاتبوو و رۆژ ئاوا نەبووبوو. دایکم باسی ئەوەی بۆ براژنەکانم دەکرد کە لە یەکێک لە گوند نشینەکانی بیستبوو، لەناکاو لە دەرگا درا، ترس دایگرتین، دایکم بە دوودڵییەوە دەرگاکەی کردوە. عەلی ئامۆزام بوو. ئەو بەشێوەیەکی وا سەیر خۆی کرد بەژووردا دایکم ملی گرت و دای لەپرمەی گریان. بە شەلە شەل، چوو لەسەر تەختە خەوێک دانیشت، ئێمەش بە هێواشی دەورەمان دا، هێشتا خوێن لە مل و قاچەکانی دەچۆڕا، وەڵامی پرسیاری دایکمی بۆ نەدەدرایەوە. لەو کاتەی کە دایکم خەریکی ئامادەکردنی تەشتێک ئاوی گەرم بوو ئەویش هێواش هیواش زمانی هاتەوە گۆ:

– کاتێک گەیشتینە سەر رووبارەکە کە سەربازەکان چواردەوریان گرتبوو، ئێمەیان پێش خۆیاندا بەرەو لای (OKH)، من شتێکم کرد کە تەواو کارێکی شێتانە بوو، وەک ئەوەی بەدەستی خۆم ملم بخەمە بەردەستی جەلادەکەم. چەند وشەیەکم بە تورکی وت، وتم بەڵکو ئەگەر وا بزانن کە زمانەکەیان دەزانم رزگارم ببێت لەدەستیان. چوومە پێشەوە بۆلای ئەفسەرێک و پێم وت کە من بێ تاوانم و لێی پاڕامەوە کە بەرم بدەن.

– بەڵام لە وەڵامدا وتی:" هەی فێڵ باز، کە تۆ تورکی دەزانیت بۆ لە ئێمەت شاردۆتەوە". فەرمانی بە سەربازەکاندا، بمدەن بەزەویدا و بە حەیزەرانەکانیان بەربوونە گیانم و بێ پسانەوە لێیان دەپرسیم کە کێ چەکی هەیە، منیش سوێندم بۆ دەخواردن کە کەس چەکی نییە. دوایی یەکێکیان لەسەر سنگم دانیشت و دوانی تر قاچەکانیان بەرزکردمەوە و هەردوو قۆڵیان گرتم و کەوتنە لێدانی پێکانم.

هەر لەیەکەم تێسرەوەندنیان وام هەست دەکرد کە ماسوولکەکانم بە تەواوەتی سڕ بوون، دووەم وام هەست دەکرد دەڵێی جەرگ و دڵم دەردەهێنن ، سێیەم، خوێن لە قاچەکانمەوە فیچقەیان کرد. ئیتر دوای ئەوە نەمتوانی پیاکێشانەکانیان بژمێرم.

– کاتێک بەهۆش خۆمدا هاتمەوە، خۆم بەتەنیا بینییەوە. بیرمکردەوە کە ئەگەر بە گاگۆڵکێش بێت خۆم بگەیەنمەوەماڵەوە. لەپر گوێم لە دەنگێک بوو دەیناڵاند. هەرچۆنێک بوو خۆم گەیاندە ئەو جێگایەی کە دەنگەکەی لێوە دەهات. کە بینیم ئەوا (Khide kek) لەسەر پشت کەوتووە و هەموو دەمو چاوی خوێنە. هەستم کرد کە هێشتا گیانی تێدا ماوە. بەڵام من خۆم نەمدەتوانی ریگا بکەم، چ جای ئەوەی ئەویش هەڵگرم. کاتێک عەلی لە قسەکانی بووەوە، دایکم بە هێواشی بە ئاوی شیلەتێن قاچەکانی بۆ شت. دوای ئەوە یەکسەر چوو بۆ ماڵی (Khide kek) تا هەواڵەکەیان پێ رابگەیەنێت. ژنان بەرەو رووبارەکە رایانکرد تا بریندارەکە بهێننەوە، عەلی ئامۆزاشم سەرەڕای برینەکانی قاچی بەرەوە چیای زارگۆڤیت کەوتە رێگا.

## ٢

سەربازەکان، عەلی ئامۆزامیان بەجێ هێشتبوو، وەکو ئەوەی کە مردبێت. پیاوەکانی تریان پێش خۆیان دابووە بەرەوە (Okh). سەربازەکان بە قۆناخە تفەنگ بەر بوونە گیانی پیاوەکان کە زۆربەیان بە ساڵا چووبوون. کاتێکیش لە هیلاکی، برسێتی و تینوێتیدا بەم لاو ئەو لادا دەکەوتن، بە حەیزەران تێیان دەکەوتن و بەزۆر هەڵیاندەستاندنەوە، هەروەها رێگایان نەدەدا کە کاروباری سەرئاویان جێبەجێ بکەن.
کە گەیشتبوونە گوندی (Okh)، هەمان شتیان دووبارە کردبووە کە بەسەر گوندی گالبووسانیاندا هێنابوو، چواردەوری خانووەکانیان گرتبوو، ژن، منداڵ و پیرەمێردەکانیان هێنابووە دەرەوە و پیاوەکانیان تێکەڵ بە ریزەکە کردبووە، دوای بەرەوە گوندی سیتریچ کەوتبوونە رێگا.
رووباری بە خوڕیی (Okh)، دڕی بە دۆڵەکە دەدا. کێڵگەکانی دامێنی چیای سپیی کردبووە بەردەڵان و لاشیو. بۆ دوا جار بە هێزی بازوو بەوپەڕی بی رێزیی و بە لێدان، پیاوەکانیان ناچار کردبوو کە بەرەوە گوندی سرتێچ هەڵگەڕێن و پیاوەکانی ئەوێشیان تێکەڵ بە ریزەکە کردبوو. بۆ لای ئێوارە گەیشتبوونە خەتەش. خەتەش کەوتۆتە نزیک لوتکەی چیای سپی و بە دارگوێز و مێوەهاتەکانی بەناوبانگە. لەوێ پیاوەکانیان ناچارکردبوو بمێننەوە و سەربازەکانیش فەرمانیان پێدرابوو کە گوندەکە بە دیقەت بپشکنن. پیاوەکانی ئەوێشیان کۆکردبووە و بە گۆچان تێیان کەوتبوون و هێنابوونیان بۆ لای ئەوانی تر. کاتێک خۆر ئاوا دەبێت، سەربازەکان هەندێک خواردنیان ئامادە کردبوو، پێش ئەوەی دەست بە خواردن بکەن، دیلەکان داوای خوردنیان کردبوو، کەمێک پەنیر و رۆن و نانیان دابوونێ کە دەبوو پێی رازیی بن.
لە نێو دیلەکاندا، منداڵیکی تێدابوو کە ناوی سەلمان بوو، تەمەنی دوانزدە ساڵان بوو و کوڕی کالۆ بوو کە سەرۆک عەشیرەتی خێڵی محەمەد بوو. باوکی سەلمان، پیاوێکی دنیا دیدە و بیر تیژ بوو. بە پێچەوانەی پیاوە خۆش باوەڕەکانی گوندەکەوە، ئەو دەیزانی کە سەربازەکان خەریکی خۆ ئامادەکردنن بۆ ئەوەی

کارەساتێکیان بەسەردا بهێنن. ئەو نەیدەتوانی وەکو ئەوانی تر چاوەکانی لێک بنێت.
دوای ئەو شتەی کە ناویان لێنابوو خواردنی ئێوارە، سەربازەکان فەرمانیان دا کە نابێت لەگەڵ یەکتر قسە بکەن و پاشان بردنیان بۆ شوێنێکی بەرئاولا. لەوێ سێ ئاگری گەورەیان کردەوە تا چوار دەوریان رووناک بکاتەوە. لە شەودا، کالۆ دەستی هێنا بەسەر کورەکەیدا و تەنها یەک شتی لە مێشکدا بوو ئەویش راکردن بوو، بەڵام هیچ هەلێکی بۆ نەرەخسا.
بەیانی زوو دیسان کاروانەکە بەرێ کەوت. لەسەرەوە، لەسەر لوتکەی چیای سپی، دەنگی گریان و لاواندنەوەی ژنەکان دەبیسترا.
گەیشتنە ئەو جێگایەی کە وا ریگای سەربازی تێدا دروست دەکرا. لەوێ کە وەکو شوێنی کرێکاری چاوی لێدەکرا، خێمەیەکی لێ بوو کە لەلایەن پیاوێکەوە چاودێری دەکرا بە ناوی بەکۆ. بۆیە (بەکۆ)شیان لەوێ دانابوو، چونکە کەمێک زمانی تورکی دەزانی. ئەو جگە لەوەی کە سەر بەهەمان عەشیرەتی کالۆ بوو، هەرەوەها دراوسێشیان بوو.
هەر لەو کاتەوەی کە گوندی خەتشی بەجێ هێشتبوو، کالۆ لە دوزگوون بابا دەپارایەوە کە بەلای ئەو خێمەیەدا رەت ببن. هەر دەیروانی تا لە کۆتایدا، خێمەکەی بەرچاو کەوت. ئیتر بیری کردەوە کە دوعاکانی قبوڵ بووە. دەستی منداڵەکەی گرت و خۆی پاش خست بۆ دوای ریزەکە. کڵاوە سوورەکەی لەسەری منداڵەکەی لابردوو و فانیلەکەی داکەند و کەمێک سەرو قژیی بۆ رێکخستوو و بە گوێیدا چرپاند:

— کوری خۆم، کە گەیشتینە بەردەم خێمەکە پاڵێکت پێوە دەنێم و یەکسەر خۆت دەکەیت بە نێو خێمەکەدا. مامە بەکۆ لەگەڵ خۆی هەرچی زووترە دەتباتەوە بۆ لای دایکت. نەترسیت، ئەگەر سەربازێکیش لێی پرسیت تۆ کێی، بڵێ من کوری بەکۆم.

کاتێک گەیشتنە بەردەم خێمەکە، سەیرێکی ئەم لاو لای خۆی کرد تا بزانێت کەس سەیریان ناکات، پاڵێکی بە کورەکەیەوە نا بۆ لای بەکۆ کە لەبەردەم خێمەکەدا وەستابوو. بەکۆش بە خێرایی پانتۆڵەکەی لەبەر داکەند و خاولییەکی تێوە پێچاو لە

تەنیشت خۆیەوە داینا. هەردووکیان دەترسان و بەکۆ دەستەکانی وەک شەق شەقە دەلەرزین.

لە پڕ ئەفسەرێک لە ریزەکەی ئەو بەرەوە پەیدابوو و هێسترەکەی لەبەردەم خێمەکەدا وەستاند. بەکۆ هاتە دەرەوە. پیاوێکی درێژ، لوتێکی هەڵۆیانە و سمێلیکی درێژی ئەستووری هەبوو. ئەفسەرەکە زۆر بە جددی سەیرێکی کرد، سەیرێکی کوڕەکەی کردو بە بەکۆی وت وەرە پێشەوە. بەکۆ ویستی غیرەت بداتە بەرخۆی و سێ هەنگاو هاتە پێشەوە، سڵاوێکی سەربازیانەی لێکرد و پێڵاوەکانی هەڵکێشاو، ناوی خۆی وت:

— بەکۆ، حەرەسی جادە سەربازییەکەم، گەورەم.

ئەفسەرەکە بە چاوێکی گوماناوییەوە لە منداڵاکەی روانی و پرسیاری کرد:

— ئەو منداڵە هی تۆیە؟

بەکۆ بە جارێک تۆقی بوو، بەڵام دیسانیش وەڵامی دایەوە:

— ئەگەر بە کۆیلەی خۆتانی قبوڵ بکەیت، گەورەم، بەڵێ کوڕی خۆمە.

ئەفسەرەکە درێژەی پێداو وتی:

— بەڵام ئەمە لە تۆ ناچێت.

بەکۆ وای نیشاندا کە گاڵتەی لەگەڵ دەکات:

— ئەم سەر دایکی داوەتەوە، گەورەم!

ئەفسەکە کەمێک بیری کردەوە و بەبێ ئەوەی هیچی تر بڵێت، پاش تاوێک بە خێرایی سواری هێسترەکەی بووەوە و شوێن ئەوانی تر کەوت. خۆی گەیاندە قافڵەکەیان کە ریزیان بەستبوو بەرەو شاخی سپی. سەر شاخەکە، جێگایەکی پان و بەرین و دامێنەکشی لا شیوەڵان بوو. لە وێوە گوندی ئەباسیان و زمێک دەبینرا. دەتووت خانووکان بەقەد شاخەکەدا پەرش و بڵاو بوونەتەوە. دووکەڵ لە کڵاوڕۆژنەکانەوە بەرز دەبووەوە و سەدەها ناڵەو هاوار لە نێو لوتکەکاندا، دەنگی دەدایەوە.

هەمانکات کە قافڵەکە بە شاخەکەدا هەڵدەزنا، کالۆ، لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە دیلەکان رازی بکات خۆیان دەرباز بکەن.

– بە چپەیەک پێی وتن، ئاگاداربن، سەربازەکان نیازیان هەیە بمانکوژن. لەم دۆڵەدا دەتوانین خۆمان رزگار بکەین، ئاخر دەبینن کە چۆن سەربازەکان کەنەفت بوون لە هیلاکیدا. ئەمە ئەو چرکەساتانەیە کە چاوەڕوانی دەکەین، وەرن با راکەین.

بەڵام کەس گوێی بە قسەکانی نەدا، ئاخر هەموو بڕوای تەواویان وابوو:

– کورە دەبەسیەتی! هیچمان لی ناکەن، قەیرێکی تر هەمومان بەردەدەن. بەڵام ئەگەر راکەین، ئەوا نیشانی دەدەین کە تاوانبارین.

گومان مێشکی پڕکردبوو، بەناچاری دوای هاوڕێکانی کەوت. دوای ئەوەی بەسەر هەندێک تاشە بەردا سەرکەوتن، هێندەیان نەمابوو بگەنە سەر لوتکەی شاخی سپی. ئەفسەرەکان کە بە سواری هێسترەوە بوون، بۆ جێگایەکی پەنا دەگەڕان کە دیلەکانی تێدا کۆبکەنەوە.

– کالۆ، بە ئەسپایی بەوانەی لە نزیکیەوە بوون وت: ئەوەتا بەدوای شوێنیکدا دەگەڕێن کە بیکەن بە گۆڕی ئێمە.

بەڵام کەس نەیدەوست بڕوا بە قسەکانی بکات. دواجار، سەربازەکان شوێنێکی لا چەپیان هەڵبژارد کە دەکەوتە سەرووی دۆڵی زمێنک، دیلەکانیان راپێچی ئەو شوێنە کرد. گەرمای مانگی ئۆگۆست، هەراسانی کردبوون، تیشکی خۆر کەللەی سەریانی دەکولاند. تاشە بەردەکانیش وەکو ساجی سوورەوەبوویان لێهاتبوو. بۆ ئەوەی لەوەش زیاتر عەزاب بچێژن، سەربازەکان بە بەردەوامی رووی تفەنگەکانیان ئاراستەی دیلەکان دەکرد، ئەوە جگە لەوەی یەک دلۆپ ئاویان نەدەدانێ.

لاشەکانیان لە سیپاڵکێک دەچوو کە لەبەر تیشکی بەهێزی خۆر بەسەر تاشەبەردەکاندا هەڵخرابێت. بە دەنگێکی نزم لەگەڵ یەک قسەیان دەکرد، تا ئەگەر شتێکی نوێ هەبێت، ئاگادرابن لێی.

سەید هۆس، کە کوڕی ماما ئاغا بوو، خۆی چەماندبووەوە بەلای زاواکەیاندا، دۆیۆ قەر، بەرانبەری دانیشتبوو، خەڵکی گوندی گالبووسان بوو. دۆیۆ سڵاوەکەی لێسەندەوە:

— ئەوە چییە، سەید هۆس، برینداری؟

سەید هۆس، دەستی بە گێڕانەوەی ئەو کارەساتە کرد کە بەسەریاندا هێنابوو:

— هەر لە بنکەی سەرەکی سەربازیی توریشمێک، دەستیان بە لێدانمان کرد. سێ رۆژ پێش ئێستا لە رێگای نوێنەری والییەوە بانگیان کردین بۆ سەربازگەی مامکی. دەستمانیان بەستەوە و بردینیان بۆ تورشمەک. چەند سەد کەسێک دەبووین، هەمومانیان کردە تەویلە و کادێنەکانەوە. لەوە دەترساین کە بەدەردی ئەرمەنیەکانمان بەرن کە هەر بە زیندوویی سوتاندیانن، بۆیە لەنێو خۆماندا کردمان بە دەمە قاڵە. ئەوە بوو دەرگاکەیان لێ کردینەوە، ئەفسەرێکی قژ زەرد کە لە گایەک دەچوو، رووبەڕومان بووەوە. غەزەب لە چاوی دەباری. دەستی کرد بە جنێودان پێمان. عەلی ئاغای خەڵکی تچرتیک وەکو شێر لێی راپەڕی و رووی کردە ئەفسەرەکە و بەزمانێکی تورکی رەوان پێی وت: "ئەرێ پێمان نالێیت ئێمە چیمان کردووە؟ بۆ بەو شێوە ناشیرینە هەڵسووکەوتمان لەگەڵ دەکەن؟

ئەفسەرەکە سەیرێکی کردوو پێی وت "لاچۆ لەبەر چاوم"، دوای ئەوە رێگای دا بڕواتەوە بۆ ماڵەوە. پاشان رووی کردە ئێمە کە لەبەردەم دەرگاکەدا وەستابووین. لە کەسێکی کە لە نزیکییەوە وەستابوو پرسی ناوت چییە؟ وەڵامی دایەوە: مام حوسێن. پاشان لە منی پرسی ئەی تۆ ناوت چییە؟ منیش لە وەڵامدا وتم سەید حوسێن. بە وەڵامەکەی من زۆر تووڕەبوو:

"بەخوا جوانە"؟ نازانم بۆ پێشتر هەڵمانەواسی و نەمانسووتان؟ لە دەست ئەم هەموو سەیید و حوسێنانە رزگارمان نابێت؟ بە تووڕەییەوە لە تەویلەکە هێنایینیانە دەرەوە و دەرگاکەیان داخستەوە و دەستیان کرد بە لێدانمان. ژمارەیەک سەربازیان تێ بەردایین و بە قامچی کەوتنە لێدانی بەری پێمان، پاشان وەکو مەیت کردینیانەوە بە نێو گەورەکەدا.

چونکە نەمدەتوانی بڕۆم، سواری هێسترێکیان کردم، ئەوە بوو کە گەیشتینە گوندی کەچ، تێکەڵ بە ئێوەیان کردین. دوای ئەو، زاواکەی دەستی بە گێرانەوەی

بەسەرهاتی خۆی کرد. لە تەنیشت ئەوانەوە سێ گەنج دانیشتیبوون و سەریان نابوو بەسەری یەکەوە و بە چپە قسەیان دەکرد. یەکێکیان عەلی باڤیا دلی بوو لە (پەخێ هاڤکی) گرتبوویان و هێنابوویان بۆ گالبووسان. کوڕێکی رەشتاڵەی شان و مل قەوی بەخۆوەوە بوو. بە پێچەوانەی ئەوەوە، حوسێن عەلی خەلیف کە خەڵکی گوندێکی جیرانیان بوو، زەعیف و باڵا مامناوەندی، قژێکی خورمایی هەبوو، بە گوێرەی تەمەنی خۆی کامڵ بوو بەڵام شەرمن بوو. ئەوەی تریان (واوێلە عەلی خدجی)، سەر بە بنەماڵەیەکی هەژار بوو، کورتە باڵا و قەڵەویچکە بوو، ژنی هێنابوو خاوەنی چوار منداڵ بوو.

## ٣

چیای زارگۆڤیت، رۆحی ئێمە، پارێزەر و پەناگامان بوو. خەڵکی ئەو گوندانەی کە لە ژێر باڵەکانی ئەو چیایەدا دەپارێزران، خەڵکێکی بەدبەخت بەڵام شۆرشگێر بوون، هەر بۆیە لە لایەن تیرانییەکانەوە دەچەوسێنرانەوە و ژیانێکی سەختیان هەبوو. چیایی زارگۆڤیت لە دایکێک دەچوو کە هەمان هەستی بەرانبەر منداڵەکانی خۆی هەیە و بەیەک چاو سەیری هەمویان دەکات. بە دارو گژوگیاو لوتکەکانی پەناگایەکی دروست کردبوو. باو بۆرانەکەشی بەهەمان شێوە پێشوازی لە گیاندارەکانی دەکرد و نرخ و بەهاو تایبەتمەندییەکانی ئەوانی دەزانی و دەیپاراستن. کەچی ببووە مۆتەکەیەک بەسەر سەریی چەوسێنەرانەوە.

ئێمەی ژن و منداڵ کە لە گوندەکەمان، گالبووسان، مابووینەوە، خۆمان سپاردبووە دەست خواو دوزگوون بابا و زارگۆڤیت. تەنها بڕوامان بەوان دەکرد، بۆیە بێ پسانەوە لە هەرسێکیان دەپاڕاینەوە.

ئێستا کە باوکم گیرابوو، براکانم خۆیان شاردبووەوە، شتێکی وا لە ماڵەکەماندا نەمابوو. شەو و رۆژ لامان وەکو یەک وابوو. بە حەسرەتەوە گوێمان بۆ دەرگای

دەرەوە هەڵخستبوو، دڵمان لەگەڵ چرپەی دارەکاندا لێی دەدا، بەڵام حەزو ئارەزووەکانمان تەنها تا سەر لوتکەی چیاکان بڕی دەکرد. هەر کە گوێمان لە وەڕینی سەگێک بوایە، خورپەیەک بە دڵماندا دەهات و رامان دەکردە دەرەوە تا بزانین چی روویداوە. بە بێ ئەوەی تەزوویەکی خۆشی بەدڵماندا بێت دەهاتینەوە ژوورەوە، بەو شێوەیە شەو و رۆژمان بەسەر دەبرد.

شەوێکیان کە هەمووومان خەوتبووین، نیوە شەو بوو، سەگەکەمان سیتچۆ چوار پێنج جارێک لەسەر یەک حەپاندیی. کە سەگەکە بێدەنگ بوو، دایکم هەستاو فانۆزێکی داگیرساند. کە سیتچۆ بێدەنگ بوو، هیوایەکەمان لا پەیدا بوو. هەمان کات کەسێک لە دەرگای دا، دایکم بەرەو لای دەرگا چوو و کردییەوە. هەمووومان بە دڵە کوتێ لە خەو راپەڕین. ئەوەی کە لەدەرگای دا، سلێمان بوو. ئەو عادەتی وابوو لای باپیرەم کە ئەو پێی دەگوت ماما ئاغا، بمێنێتەوە. کوڕێکی تەمەن بیست و دوو ساڵەی، باریکەلە، باڵا مامناوەندی، دەم بەخەندە و بیرتیژ و فێڵباز بوو. دەستی دایکمی ماچ کرد و پرسیاری ئەوەی لە بارژنەکەم کرد کە چی تازە دەزانێت و ئێمەی منداڵی لە ئامێزی خۆی گرت.

بەبێ ئەوەی قەیتانی پێڵاوەکانی بکاتەوە، یەکسەر دەستی کرد بەوەی کە دەیویست پێمان بڵێ:

— من لەسەر چیایی زارگۆڤیتەوە هاتووم، هیچ خۆتان نیگەران مەکەن. هەموو خزمەکانی ئێوە و پیاوەکانی دێهاتی ناوچە و ژن و منداڵەکان لە گرووپی نزیکەی سەد کەسیدا یەکیان گرتووە و لە نێو دارستانەکاندا خۆیان شاردۆتەوە. ئەوەی کە ئەوان پێویستیانە، نان و ئاوە. من بۆ ئەوە هاتووم کە هەندێک پێداویستی پەیدا بکەم، پێش ئەوەی بەیانی ئێوارەکەی بگەڕێمەوە بۆ لای ماما ئاغا. ئێستا دوو کەس کاریان ئەوەیە کە خواردن بۆ ئەوانەی کە ناچار کراون رابکەن، پەیدا بکەن.

